شیعر

# بەتەنیشت فەنابوونەوە

بەرزان هەستیار



کتێب: بەتەنیشت فەنابوونەوە – شیعر
نووسینی: بەرزان هەستیار
بڵاوکراوەی ئاراس– ژمارە: ٣٣٧
دەرهێنانی هونەری ناوەوە و بەرگ: ئاراس ئەکرەم
پیت لێدان: عەزیز عەبدولخالیق
هەڵەگری: دڵشاد مستەفا
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم، هەولێر– ٢٠٠٥
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (١٠٤)ی ساڵی ٢٠٠٤ی دراوەتێ

## پێشکەشە

بەڕۆحی ئەو مرۆڤەی دڵەڕاوکەی دیار نەبوونی ئێوارانی هەر کوڕێکی بڕستیان لێ دەبڕی و دەیانکردە کێڵگەی سەدان پرسیاری گورچک بڕ، بە «عەلی نەجاڕ»ی باوکم.

بە ڕۆحی شەهید «ئەنوەری عەلی نەجاڕ» ، ئەو مرۆڤەی لە چاو ترووکانێکدا وەک ئەستێرە کشا ، زۆر بە بەرزی کشا .

دیسانەوە بە:

دایکم

شنە

زەنوێر

سێ مێرگی هەمیشە مەلوولی شیعرم.

**لێوان لێوم لە وەڕسی...**

**خاڵی... خاڵی لە بارانی ڕوانین، ئەمشەو**

لەوبەر بێستانەکانی عیشقەوە چاوەڕێم کەن
دێم و بە خێراییی پێکەنین...
لە کووچەی غەریبییەکەوە، گوزەر ئەکەم
ڕەنگە نەمبینن بە خۆم و
زەمیلەیەک فرمێسکە لاسوورەوە
چۆن پیرێتی پڕ پڕی کردووم لە چرۆی سەوزی خۆی و
لەژێر سایەی درەختە ئاوسەکانی (زڕبوون)دا
کاسەی مردنێ لە سەری ئەم ژیانە بەربادەدا ئەشکێنم و
پەرداخێ لە ڕۆحی گوشراوی وەڕس بوون
چۆڕبڕ ئەکەم،
ئێی ئەی درەختە وشکەکانی عیشق
ئێوەش ئەو گۆرانییانە لەبیر کەن
کە هەموو گەنجێتیم بۆ کردن بە ئاواز و



کەس نەیچڕین،
ملوانکەی ئەو قەسیدانە بپچڕێن
لە ملی کیژۆڵەیەکدا ژەنگیان کرد و
دێرێکی ئەزبەر نەکردن،
ئەی درەختە ناشرینەکانی موحیببەت
قەت لەمشەو مەستتر نابم و
قەت لەمشەو پاکتر نابم و
قەت لەمشەو غەمگینتر نابم،
دابارێن ئەی ئەستێرەکانی ڕەنگ زەردی
هەڵوەرێن ئەی هێشووە تاڵەکانی خۆشنوودی
ئەم نێچیرە قاچەکانی نایگەیەننە
شینایییەکانی دەربازبوون
هەڵفڕن ئەی داڵە بێ مروەتەکانی مردن
ئەو دەنووکە تیژانەتان
لەو چاوانە گیر کەن کە سەردەمانێ
دەریا بوون بۆ مەلەی ئارەزووە ڕووت و قووتەکانی هەرزەیی
ئەو چاوانەی ئەمشەو لە حەسرەتی ڕژانی خوێنی گەنجیما
خۆیان کوشت و ڕژانە نێو تەلبەندەکانی تاریکی...
شەوی یەڵدایە، یەڵدا
بە پێکێ شەرابی خستەوە
من شەڕی ئەم هەموو ساڵە خەراباتەی تەمەنم پێ ناکرێ،
بە شمشێرێکی کولەوە

ئەم لەشکری حوزنە بەمن تەفروتونا نابێ،
ئەی خەون، ئەی پاکیزەترین سۆزانی
ماڵێکم هەیە لە شووشە
بەبێ دەنگی ورد و خاشی مەکە
پێخەفێکم هەیە لە دڕکەزی
جێی (خامۆشی) نابێتەوە تیا ڕاکشێ؛
ئەمشەو... ئەمشەو... ئەمشەو
ڕووبارێکم لە قەڵبەزەدا هەپروون بە هەپروون ئەبم و
تۆزێکی سپی و چیتر نا ،
پەلکە گیایەکم لەژێر پێی
حەسرەتێکا ملم لار ئەبێتەوە و
خوێنێکی سەوز و چیتر نا ،
کەنارییەکی تەنیام و لە بێ ئاسمانیدا
گۆرانی بۆ یەئس ئەڵێم و
لە مردندا نەغمەیەک و هیچی تر نا ، بەجێ دێڵم،
داباریێن ئەی تەرزە خوێن شیرنەکانی عەدەم
لاسکی ئەو بیرەوەرییانەم بشکێنن
کە ئەچنەوە سەر ڕەچەڵەکی پێکەنین
خونچەی ئەو یادگارانە هەڵوەرێنن
کە لە پێدەشتە شینەکانی ئومێدەوە
سەرەتاتکێ لەگەڵ وەرزەکانی گەشانەوەدا ئەکەن؛...
قەت لەمشەو شێتتر نابم و

قەت لەمشەو هیچتر نابم و
قەت هێندەی ئەمشەویش بە حەسرەتەوە
ناچمە ژێر چەتری شکاوی گریانێک و
یەک بەیەکی ماڵەکانی
سەما و عیشق و تێک ئالآنی نیشان نادەم

ئەیلوولی ٢٠٠٢
کۆلن

## نوێژێکی تەڕ... تەڕ وەک ئاونگ

تۆ سەرزەمینێکی جوانت لێمان ئەوێ و
سەرزەمینێکی ئارام ئەخوازی و بەڵام
ناتوانی نەهێڵی منداڵان بمرن!!
کە شەڕەکان هەڵئەگیرسێن
کۆشکەکەی خۆتیان بۆ چۆڵ کە،
با خەونێکی سپی... سپی
سپی وەکو کلوی بەفری تیا ببینن
لە وەرزەکانی تەزیندا
پاڵتۆکەی خۆتیان لەبەرکە، گەرم... گەرم
با وەک عەشق گەرم دابێن،
کە تاوە تەرزەی «پەتا» یەک لاسکی دڵەکان ئەشکێنێ
تۆ بانگیان کەرە لای خۆت و
حیکایەتی خۆش خۆشیان بۆ بگێڕەوە



بۆ ئەوەی نە تۆ
لە حەوشە بێ باخچەکانی تەنیاییدا نینۆک بکرۆژیت و
نە ئەوانیش لە پێخەفە ڕەنگ پەڕیوەکانی مەرگا
چاو لە بێ ڕەحمیی تۆ ببڕن؛
لێیان گەڕێ با دڵە کرمێکان
پڕ کەنەوە لە قوڵپی سەوزبوون،
ماڵە تاریکەکان
شادکەنەوە بە وەنەوشەی پێکەنین و
سەنگەرەکان تژی کەن لە بێ دەنگی؛
خودایە بهێڵە منداڵان
لە بن سەیوانە ئارامەکانی ڕووناکیدا
مورووەکانی عەشق و سەفا بهۆننەوە
چیمەنێکیان بۆ ڕاخە، دوور لە چاوی بەدی ئێمە
ئەو گەمانەی تێدا بکەن...
ئێمەی گەورە لە خەونیشا نایانبینین؛
خوداوەندا ئێمە زۆرین، زۆرین، زۆر
دەریاکانمان بۆ پڕ کردووی لە قەوزەی فیتنە و
چیاکانیش گوڵزارێکن لە فەساد،
خوداوەندا تازە دەست لە ئێمە بشۆ
لێگەڕێ ئەو وردیلانە
کە لە جەنگەکان دێینەوە میزمان پیا بکەن
لە بلووری چراکان و
کریستاڵەکانی عەشق ئەشکێنین

پێمان پێبکەنن،
لێیانگەڕێ
کە باخچەکان وێران ئەکەین
خەبەر بدەنە گوڵەکان
بە زەردەخەنە ساردەکانمان باوەڕ نەکەن،
بەر لەوەی مانگ ئەتک بکەین
نامەیەکی کراوە بنێرن بۆ ئەستێرەکان
دەرگای جریوەمان بە ڕوودا داخەن
بروسکەیەکی بە پەلە بنێرن بۆ ئاسمان
پەنجەرەکانی ساماڵمان لێ پێوەدا
ئێمە... ئێمە خودایە
ئێمەین دەرگای ماڵەکانی تۆ مۆر ئەکەین و
کتێبەکانی تۆ ئەسووتێنین و
پێغەمبەرەکانت شاربەدەر ئەکەین...،
لەوان گەڕێ...
لە کانییەک گروگاڵ و
لە ڕووبارێ زەردەخەنە و
زەریایەک قاقامان هەڵکێشن،
تا کاژێک لە بوغز و
پێستێک لە خوێن و
توێژێک لە گوناھ داماڵین،
کراسێک لە گزنگ و



کڵاوێ لە تریفە و
پاڵتۆیەک لە هەڵاڵ بپۆشین، خوداوەندا

٢٠٠٢/١٢/٢٢
کۆلن

## سـوور

جێ دارەکانی مامۆستا ، سوور
گلێنەکانی دوای گریان، سوور
ڕەنگی ڕوخساری دوای درۆکردنم، سوور
کە منداڵییش شەقی مزری خۆی تێ هەڵدام و
هەرزەکاری بە ئەمانەت
لە لای خۆی گلی دامەوە
لە دامێنی نامەکاندا
وێنەی دڵێکم ئەکرد و
دوو دڵۆپ خوێن
لە دامێنی نامەکانیا
جێ لێوی سوور،
لە شەرما سوور هەڵئەگەڕێین و
لە تەریقییدا هەر سوور و



لە تووڕەبوونیشا سوور
چ سرێکە و چ سیحرێکە سوور
خوێنی شەهید سوور
کفنی شەهید سوور
خوێنی خائین سوور
خوێنی جەللاد سوور
خوێنی پشیلە سوور و
خوێنی خوێن سوور
سوور سوور سوور
دیواری ژووری زیندان سوور
گلۆپی مەلهاکان سوور
فەرشی بەر پێی سەرۆکەکان سوور
شەوی پەردە سوور
هێڵی سنوورەکان سوور
چاوی پۆلیسەکان سوور
ڕوومەتی منداڵ سوور
کولمی بووکان سوور
ڕەنگی گێلاس سوور
گولاڵە سوورە، سوور
من ڕەنگی سوورم بۆیە خۆش ناوێ
سوور ئەزانم جاسووسە ، جاسووس
لە گلۆپی سفری ژووری نوستنەکەمەوە

ئەچێتە سەر دیوارەکانی ژووری تەعزیب
من بۆیە ڕەنگی سوورم خۆش ناوێ
بەیانیان لای شەهید ئەڕژێ و
نیوەڕوان لای خائین پیس ئەبێ و
ئێواران لای جەللاد هەڵئەچێ
سوور سوور سوور
سوورە چنار و
سوورە گوڵ و
سوورە ماسی وووووووووو
ژیان کەونە سندووقێکە
پڕ لە نهێنی و گوللەی سوور
جەسووریی ئەوێ بتەوێ بیکەیتەوە و
سوور بشزانی هەموو گیانت
خەڵتانی سوور ئەبێ. سوووووووور

مارتی ٢٠٠٤
کۆلن



## هەڵهاتن بۆ هەرێمەکانی خەوبینین

جانتاکەت هەڵگرە ئازیز
چما بۆنی سووتانی ژێر پێی خۆت ناکەیت؟
ڕەنگی هەڵبزرکاوی ئەو لیمۆیانە ناناسیتەوە
لە وەرزی گەییندا؟
زیزبوونی ئەو گوڵاڵانە نابینی
کە وەک فەنەر لە باخچە ئارامەکانی
عیشوە و نازا داگیرسابوون؟
جێ چرنووکی ئەو گوناهانە چاو ناکەیت
کە بەبێ ئەوەی مەرحەبایەکیش لە نێوانمانا هەبێ...
لە شان و ملیان ئاڵانین؟
نابینی... ئازیزم... نابینی
هەر کە «لاویی» بۆ سەندنەوەی سلاوێ
لە جێی خۆی بەرز ئەبێتەوە





«پیریی» کورسییەکەی لێ داگیر ئەکا!!
نابینی... ئازیزم... نابینی
گڵۆپیان بە دارتێلەکانی
کۆڵانەکانی عیشەقەوە نەهێشتووە
سەوزاییان لە چیمەنەکانی خۆشنوودیی بڕیوە و
زەردییش لە چاوە پاییزییەکانی خۆرەتاو!!
جانتاکەت بدە بە کۆڵتا
هەرچیت هەیە فڕێیاندە نێو جۆگەلەی بەرماڵەکە،
برین نەبێ،
برین ئەو زمزمی سەبرەیە
لە ساکە دەشتەکانی وەحشەتا تەڕمان ئەکاتەوە
برین ئەو زللە گەرمەیە... ئازیزی من
کە لە کەوتنە خوارەوەی چراکان
بە ئاگامان ئەهێنێت و
لە هەڵکردنی ڕەشەبا و
شەبەیخوون هەستانی تۆفانا
ئارام... ئارام قامکەکانی هەڵئەبڕێت و
بوارێکمان لە توولەڕێی شەوێکا بۆ ئەکاتەوە،
چ نەماوە ئازیزەکەم، چ نەماوە...
من ئەنووم و کاتژمێری برینێکی
کولاوەی خۆم میقات ئەکەم
من ئەنووم و دڵێکم لای



ئەو ئێوارە تەڕانەیە
کە بە پیاسە بە کەناری غەمگینیدا ڕەت ئەبووم و
بە لاچاوێ هەر بۆ ئەو کیژە ئەگەڕام
بێ بارمتە دڵم دابوویە و نەمدەزانی چی لێ ئەکا
من ئەنووم و چاوێکم وا
لە ڕێی کۆترە شینکەی ئەو خەیاڵەی
کە بەبێ وادە ئەمباتەوە
سەر هەورێک لە کارەسات و
ژێر هەرزاڵێک لە خوێن بەربوون
من ئەنووم و دەستێکم وا
بە دارمێوی مناڵییەوە جێ هێشتووە...
گەلایەکم بۆ ڕووت بوونەوە بداتێ و
هێشوو ترێی پێکەنینێک بۆ پشوودان
چ نەماوە ئازیزەکەم،
دووچاوم تژی کرد لە خەرمانەی
تەماشایەکی گوڵ گوڵیی...
خۆڵی شەڕەکان لە ئێوارەیەکی بێ ڕەنگدا
پڕیان کردووە لە کوێری
دوو دەستم سەوز، پێ دەشتێک بوون لە قەرسیل
چەمێک عەتر بە نێویانا تێ ئەپەڕی
بەیانییەک بەسەر کوانووی شەڕێکا بێدار بوونەوە
دوو کۆڵەوژ لە تەنیشتمەوە شکابوون...

دوو باڵم لە مۆمی عیشق بۆ خۆم چێکرد و
نەگەییمە لەزەتی باڵ پێکدادانێ
دۆزەخێ لە خوێن ڕشتن ڕووتی کردمەوە لە فڕین
ڕووتم، ڕووت... ڕووت لە تێک ئالآن، لە باخەکانی تووتڕکا
ڕووتم، ڕووت... ڕووت
بیابانێک لە ونبوون و
پیرەمەگرونێک لە ترس و
سیروانێک لە هەراسانی...
خزاونەتە جوگرافیای ئەم ڕۆحە نەگریسەمەوە؛
ببەخشە ئازیز من فریای ئاوڕدانەوە ناکەوم
نەبا لە خڕکەبەردی شەڕێکی دی هەڵنووتێم و
گوڵدانی ئەم مەست بوونەم ورد و خاش بێت
وەرە بەر لەوەی بخەوین
پێڵاوەکانمان تووڕ دەین و
کڵاو و چاویلکەکانمان بدەینەوە بە باو بۆران
ڕووت بینەوە و
بە ڕووتیی بچینە پەرستگای خەونە نەبینراوەکانەوە
با پشکۆی گوناهەکان بەژێر پێمانا نەچزێن،
با هێندەی کامەرانی تەنیا بین، لە خەڵوەتگاکانی خەونا

نیسان و مایسی ٢٠٠٣
کۆلن



## سێوەکە

خەتاکانت ئەوەندە لا شیرین کردین
حەرامەکانت ئەوەندە لێ حەشاردایین،
گومان لە تامی شەرابی...
خوانە حەڵاڵەکان بکەین
تاوانی کێ بوو، کێ دەستی لێ کردینە
تفەنگێکی بێ ڕوخسەت و
سەری کردین بە جانتایەکی بچکۆلەی پڕ قاچاغ و
لە باخچە بێ تەمانەکەی
ماڵی «گوناه»ا جێی هێشتین؟!
خوداوەندا تۆ بۆ ئەو سێوەت ئەوەندە لا شیرین بوو
دەستمان پڕکات لە لەزەتی تەماع و
شارە هەنگی بزێویی بەرداتە سەرمان
خەتا شیرینە خوداوەند، بمانبەخشە

ژاڵەش لە باخی بەهەشتا شین بوایە
دەستێکم هەر پێ ئەگەیان
گرنگ نییە هەنگوینە یان ژەهری مارە
گرنگ، ئەی خوداوەند، گرنگ
قاچەکانم لەسەر پشکۆی «نەء»ەکان بەجێ بێڵم و
زمان بە حەرامێک تەڕکەم
خوداوەندا بەبەر چاوی خۆتەوە من لاساریم کرد
بە بەر چاوی ئیبلیسەوە تۆش لە بەهەشتێت وەدەرنام؛
حەرام چایەکی شیرینی پێش جگەرە کێشانێکە،
پردی تووتڕکە بۆ گەیشتن بە بێستانی شەمامەکان
گەر وا نەبا خوداوەندا
تۆش ئیبلیست بەر نەدەدایە بژوێنی دڵەکەم، تا
شەکەت بوونی هەنگاوەکانم ببینی
گەر وا نەبا خوداوەندا
فوویەک بەس بوو
ئەو دۆزەخە دامرکینی
بۆ سێوە گەورەکەی سەر و
سێوە بچکۆلەکەی دڵم داتخستووە

٢٠٠٠
کۆلن



## ئافرەت

زنەیەکی ئەفسانەییە ئەو دەمەی
ژیان خێوەت لە سارایەکا هەڵ ئەدا؛
چارشێوی وشکە ساڵێکە،
لێ ناگەڕێ گوڵە گەنمەکانی تەمەن
هەناسەیەک لە شەماڵ قەرز بکەن و
شەوان خۆیانی پێ بشۆن؛
نەخشەی گۆڕخانەکانی بەدبینی
لە نێوان پەنجاکانیا هەڵئەوەرێ و
بۆ جەژنی لە دایکبوونمان
تریفەیەک بە قردێلەی ماچێکی تەڕ ئەبەستێت و
لەسەر مێزەکە جێی دێڵێ؛
تابووتی خەونێکە بە زۆر تیایا پاڵیان خستووین
هاواریش لە «با» بێ ڕەنگتر

له ئاو بێ تامتر
له ئارەقەی شەرمەزاریی ساردتر
ناگاتە ئەودیو جوگرافیای مەرگ و کفن،
وڵاتێکە... وڵات... وڵات
«قەرەجبوون»مان ئیزن ئەدا و
گیرفانە نابووتەکانمان بۆ پڕ ئەکات لە تاپۆی ڕەش
مەنفایە... مەنفا... مەنفا
چاوە پڕ لە ڕوانینەکانمان
خاڵی ئەکات لە بینین و
سیخناخ لە سەراب
هەتاوێکە مەودای نێوان
ڕۆح و پیربوونمان ئەکشێنێ؛
مەنجەنیقە و کتێبەکانمان لە دەست ئەستێنێ و
کەفتەکاری ماڵێکی بێ حەرف و
ژوورێکی خاڵی لە شیعرمان ئەکات؛
باخێکە، سبەینان هەڵئەستین
بە شووشەیەک لە عەتری گوڵەکانی خۆی
بەیانی باشمان لێ ئەکات؛
دەشتێکە چۆڵ، ئێوارانمان
بە گێژەڵووکەیەک لە تەم
بەسەر ئەکاتەوە؛
قیبلەنومایەکە لە سەفەری دەریاکانا



کەنارێکمان پیشان ئەدا
لەژێر کەپری ساماڵێکا دانیشتووە؛
گێژەنێکە سەوڵەکانمان لێ وەرئەگرێ و
ئەڵێ ئیتر گۆرانییەکانتان تەواو بوون؛
ژەهرە... ژەهر... ژەهر
ئەی پیاوی دەبەنگ بیخۆرەوە
تا ئەو دەمە وشک و تاڵەت
تەڕ و پڕ تام و شیرین بێت؛
گوللەیە... گوللەیە... گوللە
بۆ ئەوەی ئیزرائیل عەرشی
هەناسەت لێ داگیر نەکات
بهێڵە با بە خوێنەکەتا پیاسە کا؛
سوپاس ئەی خوداوەند سوپاس
وا لە قەهری تەنیایی خۆت
نوغرۆت کردین لە بەهەشتی عەشقی ئافرەت

١/٧/٢٠٠٠
کۆلن

## به تەنیشت فەنابوونەوە

ناخوێنرێنەوە، ئەو هەموو دەم و چاوانە بەکێ تەفسیر ئەکرێن و
کێ ئەتوانێ ڕەچەڵەکی ئەم هەموو ئازار و
ئەم سەرچاوە بزرانەی خوێن بدۆزێتەوە!
هەرچی گەمە و زەماوەند و زێمارەکانیشمان هەیە
لەسەر تخووبی ئاشووبەوە دەستیان پێ کردووە و
لە کەناری زەریایەک لە خۆڵەمێشدا کوژاونەتەوە؛...
ئەو خۆی لێرەش نەبوو، کەچی
نیوەی عەتری گوڵباخەکان و
نیوەی هەتاو و نیوەی گەڵا سەوزەکانی
نەمامەکانی پێکەنینی برد... فەنابوون،
خۆی بەر لەوەی لێرەشەوە ڕەت بێت
سوپایەک تاعوونی بەردایە جەستەی ئەسپی



نەرمە شەپۆلەکانی بیرەوەرییمان
کە ئەهاتیش بێ شەرمانە دەرگاکانی ئەکوتاین و
جارێک لە پریاسکەی «ئەنفال»ا...
هەڵوەرینی لەبەر ماڵەکانمانا جێ ئەهێشت و
جارێکی تر فەقیانەی داپیرەکانی
پڕ ئەکرد لە ژەهر... فەنابوون،
چ ئاشووبێکە ئەم ماڵە بێ کلاوڕۆژنەیەم
لەمسەرەوە مردن فووی پیا ئەکا و
لەوسەرەوە ئفلیج بوون دیوارەکانی سواغ ئەدا؛
تا زاکیرەم کاڵ ئەبێتەوە و
تا ژمارەکان کفت ئەبن
یەک... دوو... سێ، تا ئەچمەوە بەر هەتاوی
یەکەم دڵۆپی کوژرانم
ساڵانی پیرە برینەکانم ئەژمێرم،
ئەم سفت و سۆی ئەژنۆ شل بوونە
ئەگاتەوە بەر دەرگای ژەنگاویی گۆڕەکانیش،
زویر مەبن، من زێوان و مردووشۆر و گۆڕ هەڵکەن
زیاتر لە باخەوان و گوڵفرۆشەکان ئەناسم و
فەرهاد کوژە، لە عاشقەکان
خەنجەر بەدەستەکان، لە زامدارەکان،
جاسووسەکان، لە شەهیدەکان،

خار و خەس، لە مێرغوزارەکان، زیاتر؛
کە ناشرینە ئەم قەدەرە
ئەو دیوی دێرەکان...
لە ڕەشنووسی نیشتیمانفرۆشێک ئەچێت و
ئەمدیویشیان لە ڕەچەتەی دکتۆرێکی خەواڵوو
دیوێکی نیشتیمان لە ڕەنگی هەڵبزرکاوی دزێک و
ئەوی تری لە جەستەی کۆترە باریکەیەکی پێکراو،
بەیانیانم لە هاواری گرمۆڵەبووی
مناڵە سەموون فرۆشەکان و
نیوەڕوانم لە ئارەقەی لینجی ژنە نانکەرەکان؛
ئەیژمێرم، تا ئەگەمەوە یەکەم دەروازەی لاڵ بوونم
لەوێشەوە تا دێمەوە بەرخێوەتە شڕەکەی ئەنفال
ئەنفال... ئەنفال پیاوێکە، زرتە بۆز
چنگ لەسەر شان دوام کەوتووە و
منی کەنەفتیش بە هەڵەداوان
خۆم ئەکەم بە کەلاوەی نیوە ڕووخاوی گریانا
دوام کەوتووە و بنی پێی مێژووم ئەلێسێتەوە
تا ، گۆت بێت و نەگاتە ئەمبەر ئاواییە خنکاوەکان
ئەنفال... ئەنفال
کەناریی باڵ شکاوی ڕۆحم جێ ناهێڵێ، ئەم گوربەیە

***

ژیر نابنەوە، ئەم هەموو برژانگە تەڕە



لێوێ نییە مرواری ساغی ڕۆندکیان بخواتەوە
کێ نیشتیمانێکی دیوە زەریاکانی هەر چاو بن و
دەشتەکانی ڕەش بچنەوە لە «چاو» داو
چاوەکانیش سوور بچنەوە لە بێ برستیدا!؟
کێ نیشتیمانێکی دیوە
شەقامەکانی لە حەشمەتی تەنیاییدا
سپێدان بەدەم داڵغە لێدانەوە
دووکوڵی جگەرەکانیان بە «با» ئەن!؟
ئێوارانیش لە سووچی مەیخانەیەکدا
بەدەم گێڕانەوەی چیرۆکی بێکەسیی خۆیانەوە پێک لە یەک دەن!؟
کێ نیشتیمانێکی دیوە
بستێک لە ئاسمانی نەمابێ
ئەستێرەیەک بە ڕووتی تیا پاڵ بکەوێ و
ستیانەکەی لێ نەدزن!؟
مانگ دوگمەی کراسەکەی تیا بترازێنێ و
تریفەی مەمکی ڕاو نەکەن!؟
کێ نیشتمانێکی دیوە بە کراسێکی چڵکن و
جووتێ کەوشی دڕاوەوە، دەهری بووبێ و
لەبەر خۆیەوە بە دەنگێکی نەشاز گۆرانی بڵێ
ئەوە نیشتیمانە سەر شینەکەی منە
تکایە لە هەر جێ بینیتان

بەم ناونیشانەی خوارەوە بینێرنەوە:

...............

............

؟.........

ئاب و تشرینی دووەمی ٢٠٠٣

کۆلن



## لە باخچەی ڕەنگێکا بستێکم بدەنێ تیا بڕوێم

(کاروان کاکە سوور) لە کتێبی (منالّیم ئاسکێک بوو بەسەر پەلکە زێڕینەکاندا بازبازێنی ئەکرد)دا ئەلّێ: مالّی کابرایەک هاتە کۆلاّنەکەمانەوە، ئەم پیاوە سالاّنێک بوو کچێکی بە ناوی (فایزە)وە خۆش ویستبوو، بەلاّم نەک هەر فایزە نەبووە خێزانی، بەلّکو باوک و براکەی لەسەر ئەو مەسەلەیە لە قوتابخانە دەریان هێنابوو، شەویش بە خەوتوویی خنکاندبوویان، جا لەبەر ئەوەی (عارف تالّەبانی) نەیدەویست باوەڕ بە مەرگی (فایزە) بهێنێت، بۆیە بە خەیالّ کردبوویە هاوسەری خۆی و هەر بە خەیالّیش چەند منداڵێکی لێی هەبوو، هەمیشەش وا قسەی لەگەلّ (فایزە) و مندالّەکانی ئەکرد وەک ئەوەی بە ڕاستی پێکەوە دانیشتبن.. عارف تالّەبانی لە حەفتاو چواردا یەکێک بوو لە پێشمەرگەکانی هێزی ڕزگاری و شەهید کرا، پاش خۆی ژنێکی گەنج و چوار مندالّی هەتیوی بەجێ هێشت!!!!!.

(بە عەشقە پڕ فانتازیاکەی عارف تالّەبانی و فایزە و هەر چوار مندالّە هەتیوەکەیان پێشکەشە)

شەپۆلێ، لە حوزن پەی دەر پەی ئەمباتەوە سەر
قەوزەی کەنارە لووسەکان
پێم لە بەلکی یادگارێ ئەخلیسکێ و
تورِم ئەداتە بەر دەرگای کەونە خەمێ
مەدەد هاوارە، پڕ جامێک لە ئاوی ئەو تەمەنەم پێ بدەوە...
کە قومرییەکان باڵیان لە من قەرز ئەکرد بۆ فڕین
بزانە بەشی چەند سەدەم ئەکات!!

***

هەمیشە بە دەستێک ختووکەی
ئەو ڕۆژە مەراق بردووانەی خۆم ئەدەم...
بێهوودە چاوەڕێی شتێک بوون
لە باخچەی ڕەنگێکا بستێکیان بداتێ تیا بڕوێن
داوێنی گوڵێکیان ئەگرت، تا هیچ نەبێ
قردێلەی بۆنێکیان لە قژ دات...
بۆ ئەوەی لە پیاسەی تەمەندا قۆڵ بکەن بە قۆڵی
تاڵێ لە تریفە و تەڵێ وەنەوشەدا،
مەدەد هاوارە،
هەورێکم پێ بدە نسێ بێ بۆ سەری...
ئەو ساتە سەیرانەی
سەیوانێ نەبوو بۆ...
کڕبوونی عاتیفە و غوبابی عیشقێک تیا
بای باڵی خۆی بدا؛
بڕوانن، من تازە زات ناکەم ئاوڕێ بەمەوە و



ڕۆژانێ ببینم، ساکە دەشت
تەمەنێ سەراپا کێڵگە بێ بۆ پێک نەگەشتن و
دەست بێ بۆ ماڵئاواکردن و
بزربوون بەرز بووبێتەوە

***

نە دڵۆپێ باران
لە سیمای ژێر تەمی پەڕاگەندەیی من ئەگەشت و
نە چەمێک لە گوڵاو
هەرێزی وشک بووی ئاهێکی بۆ پاراو ئەکردم
ئەڕۆشتم وەک ئەوەی سەرابێ کێشم کا
دەڕۆیشتم من هەر خۆم لە نەسلی ئاو بووم و کەچی
خەرمانی هەناوی (فایزە) نێڵە نێڵ ئەسووتا و
نەمتوانی بڕژێم،
مەدەد هاوارە، پڕ جامێ لە عەتری
عیشقەکەی ئەوم پێ بدەوە
بزانە خەراباتی چەند سەدەی پێ ئەکەم بە گوڵجاڕ

***

بەر لەوەی بێمە لات
بە کەناری ڕووبارەکانا پیاسەم ئەکرد
بۆیە کە سلاوم لێ ئەکردی یەکپارچە تەڕبوونم لێ ئەچۆڕا
ئاخر من نەمئەتوانی بچمە باخێ شەوبۆوە و
کەچی کۆرانییەکی وشک بم، یان
پرژەی شەپۆلێ وەک دەسماڵی عیشقەکەی تۆ

تەڕ تەڕی نەکردبمەوە بۆ ڕاموسانێ
جوان نەبوو، نا، سەوزبوون شەلاڵی نەکردبم لە خۆی و
لە سێبەری «بیبیەچەمیلە»یەکدا ڕاکشێم
سەیر بوو، گوڵەکەم، سەیر
لە سای پەلکە گیایەکی بۆندارا...
هەرزاڵێکمان بۆ عیشق چێ کرد
هەرزاڵێک پڕ عەتری ماچ و
پڕ پەپوولەی ڕەنگاو ڕەنگی هەناسە
کەچی...!
مەدەد هاوارە، هەر تەنها پەپوولەیەک...
بهێنرەوە ژێر سایەی ئەم کولبەی ئەحزانی دڵەم؛
ئەو حیکایەتە برینداراانەمان پێ بدەوە
کە لە سەنگەرەکانی عیشقا...
لەشکری ئەشقیا پێیان جێ هێشتین
بماندەوە، ئیدی ئێمە و
ئەم خەراباتی وجودەی ئەوان کوجا مەرحەبا
بەڵێن بێ، بە خۆمان و جەستەی خوێناویی حیکایەتەکانمانەوە
سەری عیشق لە جانتای سەفەرێکمانا هەڵگرین،
سەفەرێک لە هەگبەی ونبوونا و
ونبوونێک لە سیلەی فەنابوونەوە،
فەنابوونێک شکۆفە لێوەی سەر بکا...
لەسەر بستێ لە خاکی ئەو ڕەنگانەی



خۆمان نەبێ کەس نەیدیبێ...
خۆمان نەبێ، کەس بە شیفۆنی ناسکیان نەخەوتبێ...

حوزەیران و تەمموز ٢٠٠٣
کۆلن

## نیشتیمانی پاکیزەکان

باخێکم هەیە لە تاوان
تەیمانێک لە زەنگیانەی عەشق
ژوورێک و بەس، هیچی تر نا،
گەورەترین نیشتیمانم تیا ئاوەدان کردۆتەوە
ئەمە یەکەمین وڵاتی سەر زەمینە داگیر ناکرێ
نیشتیمانێک پڕە لە ئافرەتی عوریان
پڕە لە کیژۆڵەی رووتی پۆشتە بە خەرمانەیەک نوور
سنوورەکانی تەلبەندن بە تاوانی وەنەوشەیی و
گوناهی پاک
کۆڵانەکانی سیخناخن لە ئەلفی چاوڕەش و
بێی قژ زەرد و
دالی مەمک هەڵووژەیی و... و...
پڕ لە سۆزانیی پاکیزەی



هەڵهاتوو لەو قەدەرانەی
بە تۆپزی لە بەردی تەوێڵیان نووسرا
ئەو پاکیزانەی پێش وادە
ئاگردانی پشکۆی گەشی شەهوەتێکیان
پێ ڕشتنە سەر پێخەفی مەخمەڵی سارد
نیشتیمانێک پڕ لە (تاوانی بەلەزەت)؛
جلەکانتان بە تەنافی شەیتانی ڕۆحی خۆتانا هەڵبواسن
شەیتانی حەیا! کە ژوور کەوتن، ڕێبوارینە
با سەروەریی ئەم نیشتیمانە نەڕووشێ
لێرە تینوێتی بە خوناو و
برسێتی بە هەڵاڵە و
ساردی بە ئاوریشم و
گەرمی لەبەر پێکدادانی باڵی پەپوولەدا
بەڕێ ئەچێ
لێرە منداڵی هەیە،
مناڵ...
مناڵ...
بچووک...
بچووک...
تنۆکێ ئاو...
ڕەحمی دایک

٢٠٠٠/٢/١١
نۆرنبێرگ

## پەرش بوون

(بۆ "جەمال غەمبار"، نەوەک بەرلەوەی جارێکی تر شیعرێکی تازە بۆ یەکتر بخوێنینەوە، غوربەت لە کەمینێکدا بمانپێکێ و نەتوانین ساتێکی تر لەژێر سەیوانی هەناسەی یەکتردا سەرخەوێ بشکێنین).

«منم، غەمبار... جارێ تەنها درزێ بکەرە دەرگاکە، با بەر شەوارەی ئاوێنەی ئەو هەموو یادە تام هەنگوینی و ژاڵەییانە نەکەویت کە لە پەنجەرە بچکۆلەکەی ژوورەکەی دامێن «گۆیژە»وە هەڵئەکات، ئەو ژوورەی شەوانێکی درێژمان بە بەفری شیعر تیا سپی کرد و، ئەو ژوورەی بەدوکەڵی جگەرە ئەمانخستە کۆکە کۆک و نیوە شەوانیش ئەو پێش ئێمە لەتری ئەدا و کە مەست ئەبوو بەناوی دڵدارەکانی ئێمەوە ئەیگرت... وەرە با تەنها یەک شەوی تر لەو ژوورەدا مناڵ بینەوە، شەوێکی تر لەو ژوورەدا دوو تاڵی تر سپی کەین و دەمێک پێکەنین سەوڵ بێت بۆ کەنارەکانی هەرزەیی و دەمێکی تر گۆچانێ لە فرمێسک وەربگرین بۆ ئاسۆ لێڵەکەی پیربوون».



لەگەڵتا ئەگەڕێمەوە
بە جووتە لەگەڵ خوێن ڕژانی شەوێکا
بێ گوێدانە شەڕ پێ فرۆشتنی کزە و
یەخە پێ گرتنی بەفر و
پاشقولی ئەو سەهۆڵانەی...
وەکە گوللەی براکانمان
لە غەفڵەتێکا وەک سوار،
سوارێکی دڵ ناسکی وەک پەشمەک
ئەمانگلێنێ و خۆی قا... قا
لە خەنینێکی ناشرینا سوور هەڵئەگەڕێ؛
ئەگەڕێینەوە بێ ئەوەی
دەم و لووتمان لە ئاست دوکەڵی سووتانی
تێرامانە سەیرەکانی خۆمان و
ڕوانینە عەنتیکەکانی ئەوان و
وردبوونەوە چاو کزەکانی دایکمانا، هەڵببەستین
من پەلی خۆم ئەدەم دەست
مناڵی ئەو یادگارە چەتونانەی
لەبەردەم ماڵی «ئەنفال»ا
خۆڵە پەتانی بە فرمێسک ئەکەن
تۆش بۆ کوێ بچی من دەستم لە پشتێنت ناکەمەوە
ئەزانم هەر دوو، لە سیلە تاریکەکانی
(١٦/٣/٨٨)ەوە
سەردەردێنین و جارێ تر

ئەرژێینەوە کەنارەکانی وشک بوون
بۆ ئەوەی تەڕمان کەنەوە
***
لەگەڵتا ئەگەڕێمەوە
سەر پێییش بێ ئەبێ هەر سەری سلاوێ
بکێشینە ئەو دیو دەرگای ماڵەکەی خوار «گۆیژە»وە
ئەو ژوورەی ئێمەی بێ وەفا
بێ ئەوەی بەتانیی ئاهێکی پیا بدەین
لە زوقمی وەحشەتا جێمان هێشت
سەرمێزەکە بۆ پارچەی مینای عەشقێکی شکاو و
نێو ڕەفەی کتێبخانەکە بۆ سۆراخی
ئەو قەسیدە شینانەی کە...
لە مەستییدا ڕام نەئەبوون، ئەگەڕێین و
ژێر قەنەفەکەش،
ئا «غەمبار» سەرێکی بۆ لار ئەکەینەوە
نەک بە دزیی یەکترەوە
لەو ژێرەدا فرمێسکێکمان حەشاردابێ،
ئەوسا ئیدی شۆڕدەبینەوە بۆ گەڕەکە
قوڕاوییەکانی تەمەن و
باخچەی گشتیی پرسەکان و
کولبەی ئەحزانی، قەترانیی بە دوکەڵی چاوەنۆڕیی
ئیدی ئەوسا عەجوول... عەجوول
پشت بۆ یەکتر دائەنێین و



بە دیواری مناڵییدا هەڵئەگەڕێین
میوە تاڵەکان ئەڕنین و
دەست ئەکەینەوە بە یاریی...
گۆڕِ گۆڕێن و تەرم تەرمێنە
جارێکی دی باز ئەدەینەوە ئەمدیو و
هەر یەکەمان توند توند
کفنەکەی لە بەدەنی ئالاندووە...
نەک لە گوڵزارێ هەڵنووتێین،...
ڕووت بینەوە و حەیامان سەگ بیفڕێنێ
***
خراپ ڕژاوین برادەر
لە کەلێن و درزی شۆستەی داڕووخاوی
ژینێکی خۆڵەمێشییەوە
چۆن بەم پەنجە کۆلانەوە
بگەینەوە سەر تخووبی سەوزبوون و
هەرێمەکانی گوڵ گرتن
چ ڕژانێکی کرێتە!!
نە فریای کۆکردنەوەی فرمێسکەکانی خۆمان و
نە بەهاواری مردنی ئەو هەموو
گوڵە بەیبوونەی نیشتیمانیشا ڕائەگەین
***
ئەی خودا ئەم ئافاتی بزربوون و
ئەم نەفرەتی خەم ساردییە چی بوو تۆ پێت بەخشیم

من ئاگرێ قاچەکانی لێ کردوومەتە کۆتەرە و
پەنجەکانی وەکو چلوورە سڕ کردووم
ساردە وەک هەراسانیم و
بێ ڕەنگە وەکو هاوارم
خودایە، دەستەودامێنی ئەو ئاگرەم
کە غەفڵەتگیرم ئەکات و
هەمیشە لە زۆنگاوەکانی دوێنێم
جۆگەلەیەک هەڵئەگرێتە سەر هەرێزەکانی ئەمڕۆم و
ئەپرژێتەوە سەر کێڵگە پەمووەکانی سبەینێشم
ئەمن تەنها لەو ئاگرە بێ ڕەنگ و بۆبەی بزربوون...
ئەترسم مۆمیام بکات و
لێوی ژاڵە و کوڵمە وردیلەکانی نازنازم
لەیەک بۆ جودا نەکرێتەوە؛
وەرە، تەنها یەک شەقاو لە یەکتر دوورین
تۆ نیو شەقاو لەو ئاگرە نزیک بەوە
بەر لەوەی زاکیرەت هەڵکرووزێنێ ئەگەمە لات
بەر لەوەی مەرزی ئەندێشەم کڵپەیەک بیکاتە شەختە
باوەشم پێدا کردوویت و
هەر بە زمانە شەرمنەکەی چاو
بە چرکەیەک و زیاتر نا
مێژووی چڵە وشک بووەکانی خوێن و
ئینجانە شکاوەکانی دڵمان گێڕاوەتەوە



لە گیرفانی بەر باخەڵی حەسرەتێکا
ئەو ئاوێنانەش دەردێنین
کە هەر جارێ سەری ولاّتیان تاشیبێن
لەتێکیان داوەتە دەستی؛
ئەو ئاوینانەی زۆر سانا
لەمبەری هەڵکوڕمانەوە
تا ئەوپەڕی داڕووخانمان پیشان ئەدا
ئەو ئاوێنانەی لە کاتی دەست بەتاڵیی و سەر بەتاڵیدا
هەتاوی تانووت و گازندەی پێ ئەگرینە چاوی یەکتر
ئاوێنە... ئاوێنە... ئاوێنە
ئێمە ئەو خێڵە نەگریسەین
بۆ تەماشای زامە دزێوەکان نەبێ
نە سڵاوێ لە ئاوێنەکان ئەکەین و
نە سڵاوی ئاوێنەش ئەسێنینەوە
ئێمە ئەو خێڵە گوناهەین
لەبەر ماڵە بێ دەرگاکەی ڕەشەبادا
ئاگر بەر بۆتە پاوانی خەونەکانمان؛
خراپ پەرش بووین برادەر، خراپ... خراپ،
کەی پرزۆڵەی ئەم ون بوونە کۆکەینەوە؟!

نیسان و مایس و حوزەیرانی ٢٠٠٢
کۆلن

## نیشتیمانێک وەکو...

دەستی برد یەکەم پەرداخی هەتاو بۆ لێوی بەرێ
دەرگایان کوتا ، بردیان
لە یەکەمین شەڕدا چاوەکانی زامدار بوون،
لەوەتەی بیرێتی نیشتیمان
بەو زامانەوە شەڕ ئەکا
ئەدۆڕێت و بەڵام جارێکی تر هەر ئەدۆڕێ و
کوڕەکانی ئەبینەوە!
لەوەتەی نیشتیمانیان بردووە بۆ شەڕ
چۆلەکەکان لەگەڵ فراوینا دوعای خێری بۆ ئەکەن و
مناڵان لەو دیو دەروازەکانی جەنگەوە
ساباتێکیان بۆ کردووە
لە مۆڵەتێکا بێتەوە
لە دەستە گچەکەکانیاندا بیشارنەوە...



نەهێڵن بگەڕێتەوە
لەو ڕۆژەوەی نیشتیمانیان برد بۆ جەبهە
عەشق کە لێرەوە ئەڕوا
چاویلکە ئەکاتە چاوی بۆ ئەوەی نەیناسینەوە
خوێن کە لیرەوە ڕەت ئەبێ
گوڵێک ئەکا بەیەخەیا و
سەبەتەیەک نانی گەرم بەدەستەوە؛
ئەمێستاکە نیشتیمانم گەلایەکە لە وەرینا...
بۆ ترۆپکە زەردەکانی بیرچوونەوە
چرایەکە ڕووناک... ڕووناک بە تاریکی
تەرمێکە ڕووت، لە کەناری بزربوونا
بزربوونێکە ڕووت و قووت
لەبەر بارێزەی سووتان و
بڵێسەی بە هەڵم بوونا

٢٠٠٢
نۆربێرگ

## پیاوێک لە شووشە

پاشماوەی پیاوێک لە عیشقی ئەرخەوانی
پیاوێک، گەرەکیە بیرەوەریی عاشقبوونی خۆی و
عیشوە و نازی ئەو کیژۆڵانە بنووسێتەوە
کە نەیانهێشت لە هەنگوینی عیشق تێر بێ
پیاوێک ئەدوێ، هەندێ جار لە بێ دەنگیدا
نێوان دێرەکانی خۆشەویستیی لەبەر ئەخوێنێتەوە
جارانێکیش هەموو گیانی ئەبێ بە قسە
کەچی کەسیش نوتقێکی لێ نابیستێت و
ئەویش بێ وەستان ئەو شتانە ئەدرکێنێ...
یەکەمجارە عیشق خۆیشی بیانبیستێ
پیاوێک زۆر بە پەلە ئەدوێ
ئەیەوێ هەر ئەمشەو
هەموو کتێبەکانی عیشق موتالاّ کا



نەبا چیتر لەبەر ڕووناکی چراوگی ماچێکا
نەتوانێ بەکامی دڵ
گەنجیی خۆی بنووسێتەوە
ئەم پیاوە بێ ئەچێ گێل بێت و
لەوەش ئەچێ هەر لە ئەزەلەوە
بۆ ئەوە خوڵقابێ...
عیشق وەک خۆرکە لێی بات و دای ڕزێنێ
کەچی شتێک هەیە هەر بە گوێیا ئەچرپێنێ:
ئەم شا ڕێیانە ئەچنەوە سەر ماڵی شکۆفە قشتەکان
شتێ بەیانیان پێی ئەڵێ
با لە خاڵخاڵۆکە بپرسین...
ماڵی دوورترین عاشق لە کوێیە
تا بەر پەنجەرەکەی ڕۆشن کەین
بە گوڵ هەسارەی ڕامووسان
بەر قاپییەکەی ڕەنگین کەین
بە شەتڵی ئەوین
با گوڵە مێخەکێ لە خۆمان بەین و
ئەوجا خل بینەوە
بۆ نێرگزە جاڕەکانی ژوان
ئاخر ناکرێ لە بیری کەیت
هەمیشە کە ئەچیتە ژوانێکی تازە
ئەبێ ناسک وەک پەشمەک و

چەشنی ڕەشە ڕێحانە...
حەوشەیەک لە دیلانێی «بۆن»ا بنوێنیت
ناکرێ نەزانیت لە هەر ژوانێکی تازەدا
دڵێکی تازە و خوێنێکی گەشترت ئەوێ...
تا بەرگەی کەللە شەقی عیشق بگرێت
تۆ پیاوێکی شووشەییت
بێ سوودە یاقووتی دڵ لە نێو دەستا بشاریەوە؛
برژێ، ئەمە ساتێکە بۆ پانۆرامای
میراتی تەمەنێک لە درەوشانەوە...
لە کانییە بڕ زمزمەکانی ئولفەت گرتن...
بە خەونە شەرمنەکانی عیشقەوە
تۆ کلیلەکانت لێ کەوتووەتە چەمی خوڕی شیعرێکەوە
بزێو وەک ئەو کیژە عەیارەی بۆ یەکەمجار خۆشی ویستی
هەموو چوالە ناسکەکانی خەیاڵی پێ بەردایتەوە و
کەچی قریوەیەکی کرد و بۆی دەرچوو
دەستەمۆترین شەو ئەمێستا لە ژوورەکەتا
بە پۆپەشمینێک لە ڕەنگی ماچ خۆی داپۆشیوە
بەر لەوەی خەنجەرەکانی سەحەرێ لە پشتەوە تیرۆری کەن
ڕوون بدوێ وەک چاوی قرژاڵ
دەنا ڕووت ڕووت ئەکەویتە
سەر سەهۆڵبەندانی وەحشەتێکی تر و
ئەوجا پاسارییەکانی شیعریش بە دووباڵی شەختەوە
ناتوانن بستێ بەرز بینەوە



پیاوێکیش لە کەسیرە بوون
تەنها پەنگوینەکان باڵەکانی خۆیانی پێ ئەبەخشن
خەزانیش کراسە دڕاوەکەی خۆی، بۆ گەرم بوونەوە
ڕوون بدوێ پیاوە شووشەییەکە، ڕوون
تۆ هەمیشە وەک خانەخوێ
لەسەر قاڵییە گوڵ گوڵیەکانی عیشق
گەمەی مزرت لەگەڵ ساتەکاندا کردووە
تۆ وا لە چارەت نووسراوە
ئێوارەیەکی نارنجی...
لە ئەستێڵکێکی پڕ قسەی خۆشی عیشقا خۆت ئەشۆیت و
بۆ دواجار ئەبیتە پەپوولەیەک
لەژێر باڵە تەنکەکانتەوە
پەلکە زێڕینە ڕەهێڵە ئەکا
بەپەڕەی گوڵی هەورێکەوە ئەنیشیەوە
ئەیکەیت بە دەفتەری بیرەوەریی...
ڕۆژەکانی تەوقەکردن لەگەڵ عیشقا
تۆ وا لە چارەت نووسراوە
لە کۆشی هەورێکا ئەمری
لە سەرپۆشی کلووی بەفرت ئەپێچن و
کرێوە لای خۆی ئەتنێژێ؛
کچە عاشقێکی قەرەج لەمێژە ئەمەی پێ وتووم...!

شوباتی ٢٠٠٤
کۆڵن

## لەودیو پەنجەرەکەوە

لەودیو پەنجەرەکەوە
بیر ئەکەمەوە
لەودیو پەنجەرەکانەوە
کفنێکی ڕەش،
ورشە و پرشەی خەونە سپییەکانم ئەپێچێتەوە
لەودیو پەنجەرەکەوە
لە قەهرا ئەتاسێم؛
ئەو هەموو شکۆفەیە لە باخچەکەدا
سەرگەرمی کرانەوەن
ئەو هەموو درەختە سەرقاڵی سەوزبوونەوەن
ئەو تەیرە جوانانە
ئاسوودە، بە خوێندنەوە خەریکن
لەودیو پەنجەرەکەوە



من قا... قا
بە ئەقڵیان پێ ئەکەنم و
خوڕ... خوڕیش بۆ شتێک ئەگریم
ڕەنگە ئەو شتە کاڵ فامی خۆم بێ؛
لەودیوی پەنجەرەکەوە...

***

لەودیو پەنجەرەیەکی تەڵخەوە
وەک ڕەنگ و ڕووی ڕەنگە بە ساڵاچووەکان
لەودیو پەنجەرەیەکی ڕوونەوە
وەک چاوی قرژاڵ
لەو هەموو هەنگاوە خاو و خلیچک و
ئەو هەموو شەقاوە گورج و گۆڵانە ڕائەمێنم
کە ئەو هەموو بەنی ئادەم و
بەنی ئافات و
بەنی ئازارە
بەسەر ئێوارە پەژموردەکانی خۆیانا
هەڵیان دێننەوە
لەودیو حەسارەکانی بەختیاریی و
لەمدیو تەمانەکانی نائومێدییەوە
پشتێنێکی شینی شلەژانم...
لە کەمەری باریکەلەی ڕۆحی خۆم بەستووە و
لەودیو پەنجەرەی دڵەی سەرکزمەوە

بوومەتە مشتێ گەڵای وشک
لە چنگی دارژانێکا

***

ئێی، چەند گوناهە «زەنوێر»...
کەوا بزانێ منی باوک
ئەبێ تا هەتایە چەترێکم
لە پیرۆزیی بۆ هەڵبدرێ
ئای کە تاوانە خۆشم
هێندە زەلیل بم،
هەموو تەمەنم، نەتوانم «زەنوێر» فێر بکەم
لە مردنما چراکان لە غەمبارییدا خەفە نەکات،
کراسە گوڵ ڕەنگەکانی نەتۆرێنێ،
کاکۆڵە جوانەکەی فەرامۆش نەکات؛
چی لەو گیرفانە پەڕپووتەی
تەمەندا جێی ئەبێتەوە؟!
کێ لەم چەمە خووڕەی ژیاندا
فریای تەواوکردنی
دوو باڵ مەلەی خۆی ئەکەوێ؟!
کێ دوو ئایەتی تەواوی عیشقی بۆ لەبەر ئەکرێت
تا هەمیشە سەرقاڵ بێت...
بەسەردانی گۆڕەکەی منەوە؟!
من ئەزانم، ڕۆژێ دێ وەک توو ئەوەرێم
ساتێ دێ، تۆزیشم نامێنێ لە ڕووی کەس بنیشێ



زەمەنێ دێ، جارێکی تر
گوڵاڵە سوورەی سەر کوڵمی یارم چاو ناکەم؛
من زۆر ڕقم لەو ڕۆژ و سات و زەمەنەیە،
میوان بوونایە
قەت نە ئەچووم بۆ بەخێرهاتنیان
مامۆستا بوونایە
هەرگیز گوێم لە وانەکانیان نەئەگرت
باوکم بوونایە
هیچ... هیچم بە قسە نەئەکردن
کچە چاو باشقاڵەکەی دراوسێشمان بوونایە
دەربەستی گرتنەوەی ماچەکانیان نەئەبووم؛
من زۆر ڕقم لە گۆڕستانەکان ئەبێتەوە
خامۆشییان سامێکە و بە کاوەخۆ
ئەنیشێتە سەر ئاوێنە خاوێنەکانی منداڵیم
کێلەکان نووکی ئەو شمشێرانەن
لە هەموو جەنگێکی خەو زڕاندا
گلێنەکانم کوڵەوار ئەکەن؛
من زۆر ڕقم لێتە ئەی مەرگ...
کاتێ تۆی چنگ بە خوێن
بەر لەوەی وا بکەم کەس خۆشی نەوێم
بە لاستیکی سەری قەڵەمەکەت ئەمسڕیتەوە،
هێشتا پێ ڕانەگەیشتووم

چارەی خۆم لای ژنەکەم ڕەش بکەم و
ئەوەندە بێ گوێی بکەم
دایکم دەرگای مەرقەدەکانم لێ ڕاوەشێنێ
سەرم نەپەرژاوە...
وێنەکانم لە ئەلبوومی ئازیزانما بدزمەوە
فریا نەکەوتووم...
بە هاوڕێکانم بڵێم
من ئێوەم زۆر... زۆر خۆش ئەوێ،
بۆیە هەر بۆ خۆتان پێتان ئەڵێم
ئەوەندەتان بوێم،
لە ونبوونما...
هیچ ئێوارەیەکی مەستیتان لێ تێک نەدەم
لە سپێدەی فەنابوونما
ئێوە پەتی دیلانێی...
خەیاڵە جوانەکانی خۆتان مەپچڕێنن؛
من پێ ڕاناکەم
ئەم هەموو نوقڵی پەیامە ببەخشمەوە
جەخار، ئەی مەرگ
تۆ ئەگەیتە سەر سەرم و
من، نە، خۆم تەیار کردووە
نە، فریای وردوخاشکردنی ڕوخساری خۆم کەوتووم و
نە، داپاچینی لقە سەوزەکانی شیعرم...



لە باخچەی دەفتەری قوتابخانەی
کیژۆڵەیەکی عاشقا
گلەیی بێت، کە دێیت و وەک ڕەشەبا ڕام ئەفرێنی
کەسانێک ماون هێشتاکە خۆشیان ئەوێم،
دڵانێک نیگەران ئەبن،
کێ ئەزانێ؟!
ڕەنگە ئێستاش کچێک مابێ
وێنەیەکی بچکۆلانەمی
لە قوژبنێکی تەریکی
دڵی خۆیا حەشار دابێ و
بەدزیی دایکییەوە بۆم بگری
پێ ئەچێ منداڵێ مابێ و لە یادی بێ
لە نێو پاسێکی قەرەباڵغدا
فرمێسکەکانیم سڕی بێ و
لە تەنیشت خۆم،
لای پەنجەرەکەوە دام نابێ...
بۆ ئەوەی پڕ بە چاوەکانی بڕوانێتە شەقامەکان
ئیدی چی بڵێم؟ چی؟
ئۆباڵی هەموویان، ئەی مەرگ، بە ئەستۆی تۆ
بە ئەستۆی شکاوی تۆ، ئەی وەحشیییییییییییییی!!

ئەیلوول و تشرینی دووەمی ٢٠٠٤
کۆلن

## لەژێر هەرزاڵی ساردی «مردن»دا

بەیانیان بەر لە خۆمان
ئەو پۆشتە و پەرداخ خۆی گۆڕیوە و
بێ وادە، تەق... تەق لە دەرگای ژوورەکانمان ئەدا
کە ئەچین بۆ قوتابخانە،
بەر لە مامۆستا، لەناو پۆلەکە وەستاوە و
ئەو وانانەی لەسەر تەختەکە نووسیوە
کە ڕۆژ نییە ئەزبەر نەکرێن
لە بازاڕ، بەر لە ئێمە دوکانەکانی کردووینەتەوە،
یاریی بە تەرازووەکان ئەکات و
حەز ئەکا هەمیشە لا سەنگ بن
لە سەیران بەر لە هەموان کەوتووەتە گۆشت برژاندن و
خەیاڵە و بە ژیانەوە گرتوویەتی...
***



خەنی ئەبێ، لە جەنگەکاندا خەنی ئەبێ
جلە تازەکانی لەبەر ئەکا و
پێڵاوە ڕەشەکانی ئەکاتە پێ
دەستێکی ئەخاتە سەر شانمان و
پەیتا... پەیتا بە دەستەکەی تریش
تفەنگەکانمان بۆ پڕ ئەکاتەوە لە فیشەک
هەردەم سەر قاڵە ، ناپەرژێتە سەر وەڵامدانەوەی سلاویش
هەر خەریکی سڕینەوەی ژمارەکانە،
ئەو هەموو ناوەکان ئەگۆڕێت،
بە ژنەکانمان ئەڵێ،
ڕووناکییەکانی ئێوەم بەخشی بە سەراب
بە منداڵەکانمان ئەڵێ
ئیدی ئێوە بۆتان نییە
لە دەروازەکانی تریقەوە هاموشۆ بکەن
بە هەموومان ئەڵێ دوا مەکەون
هاتووم ئەو قەرزەم دەنەوە
کە ئەتانەوێ خۆتانی لێ گێل بکەن
ئەو قەرزەی خۆشتان نازانن بۆ وەرتان گرت
***
دێت، لەژێر درزی دەرگای ژوورەکانمانەوە دزە ئەکات
چراکان بە هاڕەی شکانێ لاڵ ئەکا و
هەنگاومان بۆ ئەو بەندەرانە ئەدزێ
کە بەسەر مەرزەکانی تارماییدا ئەڕوانن

ئێوارانێ ناهێڵێ ئەو عەترە پایزیانە هەڵمژین
کە نەرمە بارانی خامۆشی
لە خۆڵی بەر قاپی خەیاڵێکمانی هەڵئەسێنێ
چاوی بەو ژوانانە هەڵنایە
کە بۆنی ماچ، نائومێدییەکان هەراسان ئەکات
دڵی بەو نیوەڕۆ گەرمانە تێکەڵ دێت
کە کورە عەجوولەکانی گەڕەک، نامەی دڵداریی
هەڵئەدەنە حەوشەی ماڵە دراوسێوە،
ئەی خودایە ئەم زەنگە نەشازە چییە
ساباتەکانی خۆشویستن پڕ ئەکات...
لە سەدەی بێ دەنگییەکی سارد
ئاسمانەکانی تێک ئالآن بچووک... بچووک ئەکاتەوە
بۆ داچۆڕینە نێو جۆگەلە تەڵخەکانی «بەسەرچوون»
چ گەمەیەکی کرێتە
لەبەر پەنجەرەکانی مەست بووندا...
پەردەکانی نەشئەمان لێ دائەداتەوە و
شەقاوەکانمان هەڵئەگرێتە سەر تووڵە ڕێکانی شکستبوون
لە نیوەی گۆرانییەکاندا ئیدی، ڕەژوو لە زارمان ئەبارێ
بەر لەوەی شەمامەکانی موحیببەت زەرد بن و
بە کامی دڵ بۆنیان بکەین، نقێمە شینەکانی هەناسە ئەشکێن
بەر لە ڕۆژبوونەوە، شەونم دوا ڕستەی خۆی ئەڵێ
بەر لەوەی بەهار چارۆکەکەی بکاتەوە



نێرگز وەسیەتی خۆی نووسیوە و
ژاکان بوەتە میراتگری و پەڕە سپییەکانی
داوە لە قژە دێزەکەی خۆی،...
ئێی خودایە، نە ئەکرا لێمان گەڕێی،
کەی لە جەنگەکانی ژیان وەڕس بووین
بە کەیفێکی سازەوە بازێکمان بدایە ئەودیو...
تەمیانی باخەکەی تۆوە؟
چ ئەبوو ئەم دالآشی «مردن»ە
هێند خوێن تاڵ و نەگریس نەبا
لە هەر جێوە تێپەڕ بێت ئێمە خۆمانی لێ گێل کەین؟!!
بۆ حەز ئەکەی زارەترەک بمانبینی، خودایە
بۆ ئەتەوێ کە دێینە لات
لە ترسی مەرگ هێندە هەڵهاتبین... هەڵهاتبین... هەڵهاتبین
ڕەنگمان لە ڕوو بڕابێت و بە ئاستەم شێوەمان بکەیت؟!
چەند جوان بوو خودایە، چەند جوان بوو
ئێمە خۆمان فەرسەخ بە فەرسەخ بە دوایا وێڵ بین
لە کوێ چمکێکی کراسە بێ ڕەنگەکەیان کەوتە دەست
بە حەشمەتەوە پێی بڵێین
ئەگەر کرا ئیمزایەکمان بۆ بکات و
وێنەیەکی بۆ یادگار لەگەڵ بگرین!

کانوونی یەکەمی ۲۰۰۳
کۆڵن

## سێبەری هەتاو یان نهۆمی دووەمی تەنیایی

درۆ ئەکەم گەر فەرمووی ژەمێک هەڵاڵە
لەسەر خوانە ڕەنگاڵەییەکانی خۆم، لە کەسێ بکەم
تەنیایی شک ئەبەم،
هەموو تەیرە حەرامەکان بەربدەمە ئاسمانەکەی...
تا بە دەنووک ختووکەی لێوی تەنکی ئەستێرەکان بدەن؛
هەموو تۆوە نەفرەت لێکراوەکان...
بە خاکەکەیدا تەخشان و پەخشان کەم
تا ، لە سەوزبوونا ، کەونم بۆ پڕ کەن لە حەڵاڵ
غەدرم کرد ئەو دەمانەی دارسێوەکانی تەنیاییم
بە پەڵە بەردەکانی شیعر ئەتەکاند و
گلەییم لە دڵڕەقی ئەو ئەکرد
نەمئەزانی ئەو ئەوەندە بەخشندەیە
هەر سات بمەوێ



گیرفانەکانم پڕ ئەکات لە هەڵپەڕکێی کیژۆڵان و
سەر مێزی نووسینەکەم تژی ئەکات لە کاغەزی سپی
من نازانم کام جێ بەقەد...
سیلە و کۆڵانەکانی تەنیایی قەرەباڵغن
کام تاڤگە بە خوڕتر ئەڕژێت و لەو سپیتر ئەچێتەوە!!!
بمبەخشە ئەی دلۆڤانترین هاوڕێم
ئێمە لە خۆمانەوە لە شەوەکانت ئەترسین
دەنا ئەوان لە خەیاڵی منداڵ ئەچن...
کە بیر لە ئامێزی دایکی ئەکاتەوە
دەنا ئەوان ڕووناکن وەک،
دێرە شیعرە چەرمووەکانی پرچی دایکم؛!
خەتامان کرد ناومان وەک سۆزانییەک زڕاندی و
کەچی بەسەر دەست و پێتا ئەکەوتین...
شەوێک لەبەر مانگەشەوی مەمکەکانتا ئازارەکانمان هەڵبخەین؛
ئێمە هێشتاکە نازانین کامە دەروازە...
بەسەر قەرسیلی ڕەهابوونا ئەڕوانێ
دەنا کفری نیعمەتی تەنیاییمان نەئەکرد و
لە سەفەرەکانیشماندا پریاسکەیەکمان لا جێ ئەهێشت بە ئەمانەت
تا لە گەڕانەوەماندا بنەیەکمان لەئاپوورەی نیشتیمانەکەیدا هەبێ و
هەر هیچ نەبێ لە سووچێکا و
لە بن سێبەری هەتاوی میهرەبانییەکەیدا،
کەمێک ئارەقی ڕۆژگارە چرووکەکان وشک کەینەوە
***

ئەی تەنیایی،
ئەی شۆڕەژنی دەف ژەنی شەوە بخوورداوییەکان
تۆ یەکەمین پێغەمبەری بەژن زراڤی ژنیت و
منیش یەکەم و، ڕەنگە دوا پیاوی ماندووش بم بکەومە تەهلیلە و
شایەتمان بە نوورانێتی ڕوخسار و
فانۆسی داگیرساوی هەر دە پەنجەکانت بێنم؛
دەف بژەنە، حەز ئەکەم هەر تەنیا... تەنیا
ڕۆح بەمە بەر تۆف و ڕەهێڵەی وەحشەت و
جارێکی تر گومان لە چاومەوە سەر کات
حەز ئەکەم لەم نهۆمەوە، لەم ژووره بێ دەرگا و پەنجەرەیەوە
لە سەوزبوونی هەرێز و
لە زەرد هەڵگەڕانی پووش و
لە تروکانی هێلکەی ئەو پاسارییانە و
خۆ شاردنەوەی کەروێشکێ لە سێرەی تفەنگی ڕاوچی، ڕامێنم
حەز ئەکەم لەم نهۆمەوە، شەمامەکانی خەیاڵ
بەردەمەوە نێو ئەو چەمەی...
شینایی لە تخووبەکانی شیعرا جێ ئەهێڵێ،
لە سێبەری ئەم هەتاوە فێنکەدا
بوخچە گوڵ گوڵیەکەم هەڵڕێژم و
بە کاوەخۆ ڕۆژەکان لێک جیا کەمەوە،
لەم نهۆمە پەمەییەوە...
مەرجانەکانی ناو ئاویش ئەبینم و



فڕینیش نییە نەیناسمەوە،
ئا لێرەوە تەمێنێ نابینم بۆ وەستان
ئاگرێ نییە نەتوانی لە ناویا سەما بکەیت
ئا لێرەوە سەرەتایەک بۆ سەفەرەکان ئەڕژێتە بەر پێکانم
کۆتاییەک بۆ کەسیرە بوونی شەقاو
ئەیلوول و تشرینی یەکەمی ٢٠٠٣
کۆلن

## پەنجەکانم

بە خواری نووسیان «دارا» ،
بە ترسەوە: «دوو داری دی» ؛
ئەو دوو دارە تاکو ئێستاش
بەسەوزی لە تخووبی وشکە ساڵەکانی منا
نەرم... نەرم دەست بە کەمەری عیشقەوە، سەما ئەکەن
میوەی بەلەزەت ئەگرن و
گەڵای ڕەنگاوڕەنگ دەرئەکەن؛
ئەو دوودارەی پەنجەکانم
بە خوار و خێچی ڕوانیان
لە هەموو درەختەکانی ئەم دنیایە زراڤتر باڵایان کرد،
ئەو دوو دارە ڕۆژێ سەریان سپی نابێ،
هەرگیز بە گۆچان نارۆن و
ددانەکانیان ناکەوێ،



ئەو دوو دارە هەر خۆیان بۆ خۆیان
دارستانێکی ڕەشتاڵەن لە سێبەر
ئاسمانێکی سپیکەلەن لەهەتاو ،ئەو دوودارەی قامکی منداڵیم چاندنی؛

***

هەر بۆ جارێ بە شەرمەوە چوونە بێشەڵانی قژی کچێکەوە
ئەوەندە بە کۆمە کۆم دزەیان کرد
نەیانتوانی سەر دەرکەن و
بۆ سەفەرێکی خۆشی تر
قیت ببنەوە و خۆ تەیار کەن، ئەو ئەنگوستە کێوییانەم؛...

***

چیم پێ ئەکەن ئەم ئەنگوستە لاسارانەم
یەخان ئەدڕن
پێنووس ئەگرن
لاپەڕە هەڵئەدەنەوە
ڕۆژنامان تووڕ ئەدەن
پێک ئەبەن بۆ لێوان
چی ئەکەن با بیکەن، ئازادن
هێندە نەبێ لەگەڵ تفەنگا نەچن بۆ شەڕە گەڕەک
دەنا بێنە و بە شیشێک داخیان ئەکەم؛
قژی کچانی دراوسێ ڕانەکێشن،
تەسریحەیان نەشێوێنن
با نەکەومە دارکارییان
چی ئەکەن بیکەن، گەردنیان خۆش و ئازاد،

بەرد نەگرنە ئەو پاسارییە ماندوانەی
ئێوارانێ بەو باڵە قورسانەوەی
دڵۆپ... دڵۆپ جەفای ڕۆژگاریان لێ ئەتکێ
ئەگەڕێنەوە بۆ هێلانە بێ جریوەکانیان،
بیرم ناچێت پێشیان بڵێم
لە منداڵان تووڕە نەبن
پێیان نەڵێن هەردوو چاوت دەرئەهێنم
دەنا ئەیانکەم بە خرخاڵ

***

پەنجەکانم هێندە شەرمنن
تا ئێستا نەمبینیون تینووشیان بێت
لە ژوانێکا فرسەت بێنن و لێو بنێن
بە کارێزی پڕ لە عەتری لێوی تەڕی کچێکەوە
برسیش بووبن لێم نەدیون
زات بکەن دەم بۆ هەڵاڵەی مەمکێ بەرن؛
من لە هەموو سەرکزییەکانیان خۆش ئەبم،
سەرچڵییەکانیان بە لایەک،
بەڵام نەکەن بە قرتانی لاسکی گوڵێک
خەجاڵەتی لای باخچەم کەن...
بەرگەی تانە و تەشەری خونچەکان ناگرم،
من زۆر لەوە شەرمنترم
بەیانییەک ڕێحانەیەک لە دەرگام با...
گازندەی ئەوەی لێم هەبێ



پەنجەکانم چەند تەڵێکیان کردۆتەوە و
گەلۆر... گەلۆر کردوویانە بە یەخەی چاکەتەکەما
من زۆر لەوە لاوازترم بەرگە بگرم
کانییەک گلەیی ئەوەم لێ بکا
قامکەکانم بە ڕۆژی نیوەڕۆ بەردیان گرتوەتە
کریستاڵی ڕاکشاوی بەژن و باڵای؛
چەند ئەستەمە ئەم پەنجە ڕەق و تەقانەم وا ڕابێنم
لەگەڵ پەروانە بە نەغمەی شنەبا بدوێن و
لەگەڵ ڕەشەبا بە دەنگی تۆفان؛
شێتن، ئەم پەنجانەم دەهریبوون لە کەللەی داون
لەوەتەی یەکتر ئەناسین
من ئەیلێم و ئەیلێمەوە
گەرەکم نییە بە بەردێ هیچ چۆلەکەیەک بکوژن
پاسارییەکی سەر درەختم
لە «دە»ی نێو داوەکانی ئێوەم پێ چاکترە؛
ڕازی نابم نامەی زویر بوون
بۆ ئەو کچانە بنووسن کە خیانەتیان لێ کردم
خۆشحاڵ نیم گلەییبنامە بۆ نیشتیمان بنێرن، کە ڕووی گرژ ئەکا
ئاخر ئەو خۆی هەمیشە لەبەر دڵی ئێمە
نوقڵی پێکەنین ئەنێتە زاری...
ئەگەر خۆمان لە کاتی پیاسە کردندا
پشکۆ هەڵنەدەینە بەر پێی،





نیشتیمان سەدان پەنجەی جوانی هەیە و
تا لە شیرین خەودا دەرزی ئاژنیان نەکەین
دڵی نایەت گوێچکەمانی پێ ڕاکێشێ
نیشتیمان، پەنجەکانم، نیشتیمان
مناڵێکی ڕەزا سووکە و... پیرەمێردێکی بە ویقار،
تا جلەکانی جەژنی پیس نەکەن،
کتێبەکانی قوتابخانەی بۆ نەدڕێنن،
تەزبیحە ئەبلەقەکەی لێ نەفڕێنن، تووڕە نابێ
نیشتیمان، پەنجەکانم، نیشتیمان
زۆر درەنگ هەواڵی خۆیم بۆ ئەنێرێ
ئێوە بەیانیان سەیرێکی پۆستەکەم کەن
هەر نامەیەکی گەیشتبوو
بەبێ پرس زوو بیکەنەوە
هەر لەگەڵ هەڵپچڕینیدا
پەلکە زێڕینەی پڕشنگێ
لە «کەتان»ی ڕۆحی خۆیتان ئەپێچێت و
ئەبن بە «دە» گوڵەباخی داگیرساو
بە ڕوونیی پەپوولەی دێرەکانیتان لە بەردا ئەخوێنمەوە
نیشتیمان، پەنجەکانم، نیشتیمان
ئەو مشتە خۆڵە عەجیبەی کەس تێی ناگا
ئەو بستە خاکە مەحبوبەی
هەر کاتێ پشتی لێمان بوو زەمی ئەکەین



دەمێکیش وەرچەرخایەوە
بێ ئەوەی تەریق بینەوە بە دەمیەوە پێئەکەنین
نیشتیمان، ئای لە سەرسەختیی نیشتیمان،
پەنجەکانم
نیسان و مایسی ٢٠٠٤
کۆڵن

## مەیل بڕ

تۆ کێیت؟ ببوورە تۆ کێ بوویت
بەرلەوەی کەللە سەرت لە شەرێکا لێ بزر بێ!؟
یان پێش ئەوەی خۆت
دەست لە خوێنی ڕوانینەکانی خۆت وەردەیت
تۆ کێ بوویت، کێ!؟
کاڵە و پێتاوت لە هەر توولە ڕێیەکا جێمابن
قامکەکانت بەسەر لێوی پەنگری
هەر کوانوویەکی سەرکزی دڵ وریاوە، داگیرسابن
خوێنت بەسەر هەر تاوێرێکەوە ڕەش بووبێتەوە
ڕەنگە ئێستا کەسێکی ئەوتۆ شک نەبەیت
ئولفەتی بە یادگارەکانتەوە گرتبێت و
ڕووخسەتی بە وێنەیەکت دابێ
بستێکی دیواری ژوورەکەی بکا بە ماڵی خۆی



تۆ کێ بوویت پاڵەوان!؟
تۆ کێ بوویت عاشق!؟
تۆ کێ بوویت بەد مەست!؟
تۆ کێ بوویت ئەی ئەو کەسەی
بەرماڵت لەسەر ئاو ئەگەڕا!؟
ئەفسووس، ڕەنگە تەنها
پریاسکەیەک بیرەوەریی ڕەوەند و
پڕ گرێی فەقیانەیەک ئەوینتان
لە ژێرخانی دڵێکی پیردا جێمابێ

***

لە بازاڕی دەهرا کاتێ یەکەم ئاوڕ ئەدەینەوە
چی میوەی ناسکی تەمەنە
لە سەبەتە ڕەنگ کاڵەکەی زەمەنەوە بەربوونەوە،
کیژان پێیان لێ ناون و
شەڕ نیوەی داکرماندوون و
تاکە تاکەش، سنەوبەرێک خزاندوونیە
باخەڵی فێنکی نسێی خۆیەوە
ئێمەش بێ ئاگا، شتێ بە مەزراکانی
بێ عاریدا کێشمان ئەکا و
گۆرانی بۆ لیمۆ چرچە بەجێماوەکان ئەڵێین؛
لیمۆ... هەی لیمۆ
ئێمە لە تافە تافی تەڕیتا بەڵەد نەبووین لە کوێوە
وەک مەمکی تورتی کچۆڵەیەک بتمژین

نەمانزانی چۆن خۆمانت پێ پڕ کەین لە بۆنی پشکووتن
ئیدی ئێستا بەچی سەوزمان ئەکەیتەوە، لیمۆ!
بەچی لەگەڵ ئەو ساتانەدا ئاشتمان ئەکەیتەوە
کە هێندە کاڵ بوونەتەوە
هێندە دوور، نازانم جێمان هێشتوون
یان ئەوان مەرەخەسیان کردووین،
خۆشمان نایانناسینەوە؟!!

***

سبەی من کێم!؟
ڕەنگە ئێسک و پرووسکم
لە هی قاچاخچییەک بچێ
یان دزێکی بە ئەزموون؛
ئەی سۆراخی ڕۆندکی وشک هەڵاتووی وشەیەکم
لە نێوان پەڕەی کۆنی چ کتێبێکا بکەم...
ببێتە شایەت بۆ ڕۆژانێ
دڵداریم ئەکرد و
شەڕم ئەکرد و
جنێوم ئەدا و
کە هێوریش ئەبوومەوە
خۆشترین گریان ئەگریام؛
سبەی منی قەلەندەر چیم!؟
کە وەک نەرمەبایەکی ماندوو گوزەر ئەکەم
کێ دەنگی لێکترازانی جەستەم و



کرتە کرتی مشکەکان لێکدی جوودا ئەکاتەوە...
کە ئالاونەتە ئێسکێکم
ئەوان بەختەوەرن،
کەسیان نییە لەودیو گۆڕەوە بیریان کات
منیش، ئای منیش... دەی بەهەرحاڵ
سوپاس بۆ گڵێ مەیل بڕ
دەنا تا مەحشەر ئەبوو
گوێ لە واوەیلا دڵ پڕ وێنەکان بگرم

***

ئەی گڵ، تۆ جارێکی تر مۆڵەتمان نادەی
شتێ بڵێین لە گۆرانی بچێت، بۆ ئازیزەکانمان
ڕێ نادەیت چرپەیەک بشنەوین
زکری سەمایەک بنێتەوە دڵمان
من گازندەت لێ ناکەم
تۆ نەبایت، کەس نەیئەتوانی
چێژ لە کەرنەڤاڵی فڕینی
پۆلە مەلی ئێواران ببینێ،
کانیی کەسی دەست نەئەکەوت
دەم و چاوێکی پاش ماندووبوونی پێ تەڕکات
شەقامەکان لە تەنیایی خۆیاندا
سەری جاڕزبوونیان ئەخستە نێو لەپی دەستیان
کەسێ مەیلی لە داباریینی هەور و
شینبوونەوەی هەرێزەکان نەبوو

ئەی دواهەمین خەڵوەتگا
تۆ هەموو گوناه و نوێژەکانیشمان گۆڕەوشار ئەدەیت
وەلێ نایەڵێت ئەنگوستەکانی تر
لە شمشاڵ ژەنینی خۆیان بکەون
تۆ چیت! لە کوێی تۆدا
بۆ یەقینی وەڵامەکان بگەڕێم؟
گەر داوەتی فنجانێ قاوەی تاڵم کەیت
ئەبێ لەتەک کام پیاوخراپ
یان کام ئەسحابەدا لەسەر مێزێ کۆم کەیتەوە...
ئیدی نەتوانم چەند ساتێ خۆم بدزمەوە و
سەرێ لە کەسوکار و هاوڕێ و ئەو کیژانە بدەم
کە بەیەکتریمان ئەوت «یان بۆ تۆم یان بۆ گڵ»
ڕێم نەدەی بەیانیانی جەژن
لەگەڵ پیاوانی گەڕەک
لە دەرگای ماڵە دراوسێکان بدەم و بڵێم:
خوا موبارەکی کا،
نوقڵەکەمان بەنێ و ئەڕۆین!؟
نەهێڵێت ڕۆژێکی زستان
سەر بکەمەوە بە چاپخانەی «شەعب»ا و
گوێ لە شەکرە جنێوەکانی «حەمە عومەر عوسمان» و
زرەی پیاڵە و تەقەی دۆمینە بگرم
یان دیوانێکی ئەو گەنجە ڕۆح سووکە



وەک دیارییەکی بۆنخۆش وەربگرم
کە پڕە لە گەواڵە شیعری عیشوەدار
نازانم ئەی گڵ، نازانم
تۆ، هەم دەستی ناسکی
خەونە پەپوولەییەکان ئەگریت و
بەسەر پردی سیراتەکانی سووتانا ئەیانپەڕێنیتەوە
هەم قاچی هەنگاوە گورجەکان ئەبەستیت و
بۆ خەرەندێکی هەزار بە هەزاریان بەر ئەدەیتەوە
ئیدی من لەم دووڕیانەدا ئەبێ
دەمێ دەستە تەڕەکانت بگوشم و
دەمێکی دی لە ڕوخسارە دزێوەکەت ورد ببمەوە؛
هەراسانم ئەی گڵ، لەم دوو ڕووییەت
خۆشحاڵم ئەی گڵ، بە وەفاداریت
بێزارم ئەی گڵ، بەدەست بێ ڕەحمیتەوە؛
تۆ ئەو جەنگاوەرە سەیرەیت
لە دوو سەنگەرا سێرەت گرتووە
لە دوو مەیدانا تۆز ئەکەیت
تۆ ئەو کتێبە عەنتیکەیەیت
لە هەردوو لاوە ئەخوێنرێتەوە و
جارێک پڕیت لە حیکمەت و
جارێکی تر بێ بەریی لە مانا،
سەیرمانکە ئێمە چەند بزەڵەین
هەر ئەڵێی نە بامان دیوە، نە بۆران

تەماشاکە چەند خەم ساردانە
سیپارەی ژیان پەڕە... پەڕە هەڵئەدەینەوە
زەحمەتە ئێمە لە نهێنییەکانی تۆ و
تۆش لە ڕازەکانی ئێمە حاڵی بیت
کەچی پێکەوە لە هیچ شتێک ناچین...
لە دڵنیایی نەبێت
بە جیاش لە هەموو شتێک ئەچین
عاشقە و ماشقە نەبێت

***

ئێمەش ئەبینەوە مەیل بڕ و
دەمی نەسلی خۆمان پڕ ئەکەینەوە لە بێ دەنگی
تۆ توند... توند ڕامانئەمووسیت و
لە نێوانی باسکە ڕەقەڵەکانتا ورد و خاش ئەبین
ئای، ئەبین بە خۆڵ
ئەبین بە جەنگاوەرە سەیر و کتێبە عەنتیکەکە
ئەی مەیل بڕ
ئێمەی ئادەمیزاد لە شەڕگەکاندا
شێتانە ئەکوژرێین بۆ ئەوەی
تاڵەکانی قژی تۆ هەڵنەوەرێن
خوێن ئەداتە کەللەمان و ئەکوژین
تا قسە خۆشەکانی تۆمان لێ نەفرێنن

***

دەربەست نایەم،



تۆ چیم ناو ئەنێی، ناوم نێ
قەدەرێکی جوانە دڵخوازێکت هەبێ
نە گوێی لێت بێ و نە بتبینێ
کەچی هەمیشە دڵێکتان لای یەکتر بێ و
خەریکی گەمەیەکی سەیر بن
یارییەک هیچتان نەزانن
کەی کۆتایی دێ و
کێش ئەیباتەوە
قەدەرێکی کۆمیدییە
گەمەیەکی ئەزەلییە
دڵدارییەکی سەمەرە، ئەی مەیل بڕ!!!

نیسان و مایسی ٢٠٠٤
کۆڵن

## مەرگی جیهانی یەکەم!

وەرن بە نهێنییەکانمانەوە سەفەرەکە تەواو بکەین
بە نهێنییە ماتەکانمانەوە...
لەگەڵ یەکتریدا بدوێین
ئێمە دڵێکمان هەیە
جێگەی دنیایەک نهێنیی تیا ئەبێتەوە
وەرن با هیچ نەبێ
مشتێ لەو نیعمەتە...
بۆ خۆمان هەڵگرین
ئێمە بە نهێنییەکانمانەوە
ئەتوانین خۆشەویستی بکەین و
ڕەشەبای جووت بوون
بە ژوورەکانمانا گڤەی بێ و
ڕووی تەوقەکردنمان هەبێ و



سەرخۆشیی لە یەک بکەین و
سوێند بە سەری یەکتر بخۆین؛
ئێمە بە باخەڵێک نهێنییەوە نەبێ
نە کیلۆیەک گۆشت و
نە دوو کولێرە و
نە کتێبێک و
نە شووشەیەک شەراب ئەتوانین بکڕین
وەرن با بە عیشقی سۆفیەکەوە بۆ خودا
نهێنییەکانی خۆمان خۆش بوێ...
دەنا لە سەرکێشیمان ڕووت ئەبینەوە،
لووتی غرووریمان ئەشکێ؛
با بە تاسەی دڵدارێکی هەرزەکارەوە
وەک نامەیەکی شەرمنی چرچ و لۆچی
سووچی گیرفانی باخەڵی چاکەتەکەمان
دەفتەری نهێنییەکانمان لە دەستی
یار و ئەغیار بپارێزین
بۆ ئەوەی بتوانین هەمیشە...
دڵێکمان هەبێ لێ بدا،
چاوێک شک بەرین لە تەمتومان نەپارێتەوە
ڕێی ئەودیوی شووشەکان ببینێت
دوو دەستمان هەبێ
ڕووخسەت وەرنەگرن بۆ گوشینی مەمکان

وەرن با کونجێ لە دڵدا...
هەردەم بەداخراوی جێ بێڵین
هۆدەیەک لە ماڵی زماندا گڵۆم بدەین
بۆ ئەوەی جوانیی خۆمان نەدۆڕێنین
تاکو ڕوومان بێ لە ئاست عیشقا سەر هەڵبڕین و
دوو وشەی جوانمان پێ بێ
لەگەڵ گوڵەباخا پێی بدوێین؛
ئێمە بە نهێنییەکانمانەوە پۆشتەین
بە نهێنییەکانمانەوە ئەتوانین
داوەتی چایەک بۆ یەکتر بکەین
هەر بەوانیشەوە هاوسەرەکانمان ڕێمان پێ ئەدەن
پێخەفی تەزیویان بۆ پڕ کەین
لە پشکۆی شەهوەت،
هەناسە گەرمەکانیان بۆ باوەشێن کەین؛
ئێی لە ڕوخساری دزێو و
دڵی کرمێ و
دەستی لەرزۆک و
دوو چاوی شۆڕمان...
کە باڵەخانەی نهێنییەکانمان ئەڕمێت و
شتێ نامێنێ لای خۆمان گلی دەینەوە،
کە ماڵی نهێنییەکانمان
دەرگای ئەکەوێتە سەر پشت و



ئەبینە کەلاوەیەکی «ئاشکرا»،
سەرەنوێلکێکی بەجێماو؛
ئای کە ناشرینین هەموومان
ئای کە بۆگەنمان ناخۆشە
ئێمەی کەلاوەی وێران و
زبڵی نێو چەقی شەقامان؛
ئەشکێین، وەک بەربوونەوەی دڵێک
بە دەستی خیانەتەوە...
کاتێ چەپەری نهێنییەک نەمێنێ
شەڕەتفەنگی «ژیان»ی لە پاڵدا بکەین
وەرن با وا زوو ورد نەبین
ئەو دەروازانە باز مەکەن
کە لە پشتیەوە سوپایەک نهێنیی بەد فەساڵ
لە هەرێزە سەوزەکاندا قاچیان لێ ڕاکێشاوە
ئەو دەروازانە کلۆم دەن،
نهێنییەکان دیزە بەدەرخۆنە بکەن
گۆڕ غەریبیان کەن، دەخیلە، دەخیل،
با مەرگی جیهانی یەکەم بەرپا نەبێ!!

٢٠٠٤/١١/٢٣
کۆلن

## با شەرابێ لە دەستی عیشق وەربگرین

کەس بەتەمای چرکەیەک گەڕانەوەی تەمەن نییە
کەس گوێ بۆ دەنگێ شل ناکا...
لەودیو دەرگاکەوە بلێ:
بیکەنەوە
من زەمەنە کوژراوەکانی ئێوەم، زیندوو بوومەتەوە
ئێوارە بێ مەیلەکانتانم،
هاتوومەوە جارێکی تر...
خۆم لە ئەستێلکی ڕەنگەکان وەردەم
بیکەنەوە، من ئەو بارانەم
کە نەتانوێرا لە بەریا بە ڕووتیی باوەش بکەن بەیەکترا
ئەو نامەیەم پڕکێشی ئەوەتان نەکرد
بەدەنگی بەرز بیخوێننەوە
بیکەنەوە، جارێکی تر ئەتوانن ئەو گۆرانییانە بشنەون



کە جاران حەوسەڵەی ئەوەتان نەبوو
لەبەر گریان بە دیاریانەوە دانیشن
ئەو شەرابەم، کە نەتانتوانی
لەگەڵ یارەکانتانا نۆشی کەن،
بیکەنەوە،
ئەفسوونێکم پێیە ئەتانباتەوە
سەر مافوورەکانی هەرزەیی
شادتان ئەکاتەوە بە خەت و خاڵی
پەروانەکانی مناڵی؛
کەس دەرگا لەو دەنگە ناکاتەوە
کەس متمانەی پێ ناکات و
پەردەی پەنجەرەکەی لانادا بزانێ کێیە، من نەبێ؛
پێ بزانم یان نا
دەستی گرتووم و بەسەرتاپای وجودا ئەمگێڕێ
خۆی پێم ئەڵێ
من شەرابە سوورە کەونەکەی عیشقم
پێکێکم لێ فڕ کەن، پێکێ،
با سەرزەمین...
کاژی گوناهەکانی داماڵێ،
وشک بێتەوە لە سێڵاوی «ڕیا» و
تەبەڕا بێ لە تاوان...
تا کەس نەبێ حەشری لەگەڵ حەشری؛

ئەی عیشق، منی پیرەدار
وەک شێتێکی ڕۆح سووک بە ئەقڵی خامەوە
خۆم ئەخەمەوە بەختی تۆ،
بۆ کوێم ئەبەی،
لە کوێ لەبەردەم دەروازەیەکا تورم ئەدەی...
مەیلی خۆتە،
دڵنیام جارێکی تر
ناپاکیم لەگەڵ ناکەیت و
نامدەیتەوە دەست چەتەکانی مردن

***

من دەرگات لێ ئەکەمەوە
سەرکەوە بۆ کۆلێتە شێدارەکانی دەروونم
دامگیرسێنە، با سوورەتەکان
بەڕەنگی پرچی ئاشە و فاتمە ببینم
وەک چراوگ ڕۆشنم کە،
من بەردی ئەو قەدەرەم بە کۆڵەوەیە
کە ئەبێ عیشق زیندووم کاتەوە
بچۆرە ناوچە حەرامەکانی گیانمەوە
کەسێ لێت ناپرسێتەوە، تۆ کوێندەریت
کەسێ ڕووت لێ گرژ ناکا و
لێوت لێ هەڵناقورچێنێ
من خۆم دەمێکە ئەزانم لە مردنما
نە خاک لە خۆیم ئەگرێت و



نە دەریا پێشوازیم ئەکا و
نە ئاسمانیش لایەکم لێ ئەکاتەوە
چونکە من کوڕی هیچیان نیم؛
تۆ شک نەبەم، ناوێرم بمرم، ئەی عیشق
تۆ نەبیت، لاشەم سەگ ئەیخوا، ئەی عیشق
تۆم لێ دیار نەبیت، ئەوەندە بە غیرەت نیم
چاو لە مردن سوور کەمەوە، ئەی عیشق
تۆ مۆمێکم پێ نەبەخشیت
زاتی نووسینەوەی قەسیدەیەکی تازەم نییە، ئەی عیشق؛
من کوڕە بچکۆلەکەتم
بیرت نایە دەستت بەسەردا هێنام و
وتت ئەم کوڕە سەرخڕەم...
لەوانی تر خۆشتر ئەوێ
چونکە لێ ناگەڕێ یارەکەی...
بیپەرژێتە سەر بیرکردنەوە
لە زەمەنەکانی هەڵنووتان و
بە ماچێ ئەیهێنێتەوە ژێر کەپری شکۆفەکان!
دێتەوە یادت پێت وتم
کوڕم، من دەستی موبارەکی خۆمت بەسەردا دێنم
لە هەر کوێ هەڵوەرین...
گەمارۆی هێرۆ سپییەکانی ڕۆحیان دایت
ناوم بێنە، ئەگەمە لات!
هەر کات لە دووڕیانێکا

قیبلەنوومات چنگ نەکەوت
بە تیلەی چاوێ سەیرمکە
لە گیرفانی چاکەتەکەتا ئەمبینیت؛
ئەی عیشق من فرزەندی تۆم
لە لاساریم ببوورە
شێتییەک داگیری کردووم،
ببینە دوا جار چۆن
وەک سەربازێکی هەڵاتوو
بە پەشیمانی گەڕامەوە ئاستانەکەت،
تەماشاکە ملم چەند لە موو باریکترە
گەردن ئازادی پێ ناوێ
ئەزانم تەورت لە گوڵ و
تفەنگت لە گزنگ و
گوللەشت لە تیشکی زەردە پەڕە،
بنۆڕە شەرمنیم ئەی عیشق
بە کاڵفامی خۆم لەگەڵ کە
جێم بکەوە،
لە دۆزەخی ئەو وەحشەتەدا...
نەبا ئەمجارە بە ڕاستی ڕەق ببمەوە!!!!

**دیسەمبەری ٢٠٠٤**
**کۆڵن**



## پێڕست